# زەردێ

## جاڵجاڵۆکە ڕەشەکان

ناوی کتێب: زەردێ جاڵجاڵۆکە ڕەشەکان
دانانی: واریسی ئەلکندی
وەرگێڕانی: پەریان ئەحمەد زەردەشت
هەڵەچن: ڕەووف مەلایی
بڵاوکراوەی: بوڕاق بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە
دیزاین و جێبەجێکردن: کۆمپانیای نوور
نیگار: تەیێبە عەبدوڵلا
ڕەنگی ژمارەیی: هودا نەعیم
سەرپەرشتی هونەریی: محەمەد ئەلقاسمی
تیراژ: ٥٠٠٠ دانە
ISBN: ٩٧٨-٩٦٤-١٩٢-٣٤٧-٣
چاپی یەکەم ٢٠١١


**ژمارەی سپاردن بە دەزگای کتێب و بەڵگەنامەکان- بەغدا (١٤١٠)ساڵی ٢٠٠٩**
Web site: www.alburagh.com E-mail: Info@alburagh.com

زەردێ زەردەواڵەیەک بوو لە گەڵ شاهەنگ و هەنگەکان لە گوڵزارێکی جوان و ڕەنگاوڕەنگدا لە شانە هەنگێکی بەتامدا دەژیا، ئەڵبەتە هەمووان خۆشیان دەویست و هەمیشە شانەکە لە جۆرەها جانەوەری شەڕانی و گازندە و ئاژەڵی‌تر دەپاراست، بەیانیان پێش هەموو ئەندامانی شانەکە هەڵدەستا و شانە هەنگەکانی پاک دەکردەوە و کارەکەرەکانی بەسەر دەکردەوە و ئینجا هەمووان هەڵدەستان، تا ڕۆژێکی نوێی و جوان و خۆش دەست پێ بکەن وکاری ڕۆژانەی خۆیان بەسەر بەن.

ئینجا به شێوەیەکی ڕێکوپێک خۆراکی بۆ شاهەنگ و هەنگەکان ئامادە
دەکرد، لە پاشـان لە گەڵ هەندێ هەنگدا دەچوو بۆ پاک کردنەوەی
شـانەکە و لابردنـی چیلکـە و گـەڵای وشـکی درەخـت و دەرکردنی
جانـەوەرە نامۆکان و پاراسـتنی عەماری مۆم لە گەرما و سـەرمادا و
خاوێن کردن لە تەپوتۆز، خڵتە و...

پاش ئەوەی زەردێ بە شێوەیەکی ڕێکوپێک ئەرکەکانی لە ناو شانەکەدا بە جێ دەهێنا، ئینجا عەودالی دۆزینەوەی گوڵزار و گژوگیای تەڕوپەڕ و مێوەی نوێ دەبوو، تا هەنگەکانی بباتە سەر و شیلەی گوڵان هەڵمژن و هەنگوینی خۆش و فرەجۆر و ڕەسەن بۆ سوودی مرۆڤ بەرهەم بێنن.

زەردێی چاوەترس و خۆشەویست، لە کاتی بڵاو بوونەوەی هەنگەکان و گەڕانیان بە دوای شیلەی گوڵە، پارێزگاریی دەکردن..

کاتێکیش ئێواران دەگەڕانەوە شانەکەیان، هەر دوو باڵە ناسکەکانی بە هێواشی و زرافی لە تەک هەندێ هەنگی‌تـردا لـە ناو شـانەکەدا دەجوڵان تا ناو شـانەکە فێنـک بکەنەوە و پاش ئەرک و کۆششـی کار، شاهەنگەکەیان بە هێمنی وهێوەری بنوێ، جاروباریش ئاهەنگیان دەگێڕا، تا هەمووان کاتێکی خۆش بە سەر بەرن.

ڕۆژێکیان زەردێ وەک ڕۆژانیتر دەر دەچێ بۆ کار بەو هیوایەی کە گوڵزار و کێلگەی نوێ و میوەجاتی گەیی بدۆزێتەوە، بەڵام دەکەوێتە داوی جاڵجاڵۆکە ڕەشەکانەوە، هەرچەند دەکۆشێ کە خۆی لەو داوە ڕزگار کات، بەڵام بێ سوود بوو، تەنانەت زیاتر داوەکانی تەنە جاڵجاڵۆکەکە لێوەی دەئاڵا... ئەڵبەتە جاڵجاڵۆکەکان شادمان بوون بەگرتنی زەردێ.

شەو داهات، شاهەنگ و هەموو دانیشتوانی شانەکە شپرزە و غەمبار بوون، تەنانەت لەو شەوەدا مانگیش ڕووی خۆی دەر نەخست و کێڵگەکان تاریک بوون، هەر بۆیە شاهەنگەکە بڕیاریدا هەمووان دەرچن و بڵێسەی ئاگر هەڵگرن و بگەڕێن، زۆر گەڕان، بەڵام هیچیان دەستگیر نەبوو، هەر بۆیە گەڕانەوە شانەکەی خۆیان، شاهەنگ لە خەمدا دایە پرمەی گریان.

لە نیوەشەودا، جاڵجاڵۆکە ڕەشەکان لە کونە تاریکەکانی خۆیانەوە دەر چوون و داوی تەونەکەیان پچڕی و زەردەیان بە دیلی بردە شوێنێکی نادیارەوە. بە ڕک و کینایەتییەوە پرسیاری ئەوەیان لێکرد کە چەند هەنگوین لە شانەکە دایە و چەند هەنگ چەکدارن و جۆری چەکەکانیان و زانیاری دەربارەی شاهەنگەکە، بەڵام زەردێ خۆڕاگرانە هیچی لە دەم نەهاتە دەرێ، چونکە دەیزانی دەیانەوێ هێرش بکەنە سەر شانەکە.

زەردێ هەر بیری لە پیلانێک دەکردەوە، کە
چۆن خۆی لە بەندی ڕزگار بکات، شانەکە لە
هێرشی جاڵجاڵۆکەکانی گوت، من نازانم
چەکەکانی شانەکە چین، تەنانەت ژمارەی
هەنگەکان و چەندوچۆنی هەنگوینەکەی، هەر
بۆیە نامەیەک بۆ شاهەنگ دەنووسم تا
خشتەیەکتان بۆ بکێشێ سەبارەت بە شانە و
ڕادەی هەنگوین و چەکەکان و ژمارەی
هەنگەکانتان بۆ دیاری بکات، ئەوەش
بەرانبەر بە ئازاد کردنم. بەم جۆرەش
دەتوانن هێرش بکەنە سەر
شانەکە و بە ئەنجام دەگەن.

جاڵجاڵۆکە ڕەشەکان بیرۆکەکەیان بەدڵ بوو، زەردێ نامەیەکی بۆ شاهەنگەکە نووسی، بە خێرایی جاڵجاڵۆکەیەک هەڵیگرت و بردی دای بە شاهەنگەکە و چاوەڕێی وەڵامی کرد، شاهەنگە و هەموو هەنگەکان دڵشاد بوون بە نامەکەی زەردێ و زانییان کە هێشتا لە ژیاندایە و هیچ زانیارییەکی بە دەستەوە نەداوە و ئەوەشیان زانی کە زەردێ بەم نامەیە جاڵجاڵۆکەکانی چەواشە کردووە، هەر بۆیە بیری لە ڕێبازێک کردەوە کە زەردێ ڕزگارکات

شاهەنگەکە نامەیەکی بۆ جاڵجاڵۆکەکان نووسی تیایدا وتی: سبەینێ خۆی و هەنگەکان شانەکە بەجێ دێڵن، با ئەوانیش بێن هەنگوینەکە بەرن، هاوکات فەرمانی بە هەنگەکاندا گۆزەیەکی بن کون بێنن و پڕی بکەن لە هەنگوین و بیخەنە سەر کالیسکەیەک و لەگەڵ نامەکە بە جاڵجاڵۆکەدا بینێرنەوە، جاڵجاڵۆکەکە کالیسکەکەی ڕاکێشا و لە گۆزە هەنگوین دڵۆپەی دەکردە سەر زەوی بە بێ ئەوەی جاڵجاڵۆکەکە بەم پلانە بزانێ، گەیشتە شوێنی خۆی و نامەو ئەو هەنگوینەی کە لە گوزەکەدا مایەوە دای بە جاڵجاڵۆکەکان، ئەڵبەتە ئەوانیش دڵشاد بوون و خۆیان بۆ هێرشی سبەینێ ئامادەکرد.

هەنگەکان بە هۆی دڵۆپەی هەنگوینەکەوە، شوێنی زیندانیکردنی زەردێیان زانی، بەیانی هەمووان بە چەکەوە دایان لە شەقەی باڵ و لە دەوروبەری زیندانەکەی زەردێ بڵاو بوونەوە و چزوەکانیان ئامادە کرد، جاڵجاڵۆکەکان هاتنە دەرێ، بەو نیازەی بەرەو شانەکە بڕۆن، لە نیوەی ڕێگادا شاهەنگ و هەنگەکانی لە پشتەوە هێرشیان کردە سەر جاڵجاڵۆکەکان و چزۆکانیان لێ چەقاندن و لە ناویان بردن و زەردێیان ئازارد کرد و بە خۆشی گەڕانەوە شانەکەیان و تا ئێوارە ئاهەنگیان گێڕا، پەپوولە و پاسارییە ڕەنگاورەنگ و کۆترە سپییەکان بەشدارییان تێیا کرد، تەنانەت مانگ تیشکی ڕووناکی بەخشی و لەو خۆشییەدا بەشداری کرد..

## زەردێ

هەوڵدە کە کەسایەتی بە پێی ئەو چوار گۆشانەی لە چوار گۆشەکەدا بکێشی.

## ئەمە لەبەر کە

پێغەمبەر (د.خ) دەفەرموێ

### باشترین کەسان ئەوانەن کە سوودیان بۆ خەڵک هەیە.

زەردێ زەردەواڵەیەکی جوانە، بە ڕاستی و چالاکی بە بێ وچان کاری دەکرد و ئەرکەکانی بە شێوەیەکی جوان و پوخت بەجێ دەهێنا، ئا لەم چیرۆکەدا دەرکەوت کە چۆن شاهەنگەکە و هەموو هەنگەکان خەمبار بوون بۆ دواکەوتن و نەگەڕانەوەی زەردێ و هەمووان چوون بۆ فریاکەوتنی.. هەر بۆیە دەبێ ئێمەش بە شێوەیەکی باش کار بکەین تا لای هەمووانەوە خۆشەویست بین.